

دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی

# دیوانی سەودایی



کۆکردنەوەو ئامادەکردنی
عوسمان هەورامی



کۆماری عیراق
وەزارەتی رۆشنبیری و راگەیاندن
دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی
زنجیرەی ژمارە (۲۹۸)

# دیوانی سەودایی

شێخ ئیسماعیلی دۆڵان
۱۸٤٢ ـ ۱۹۳۷

بەشی یەکەم

ئامادە کردن و ساغ کردنەوە و لێکدانەوە و پێشەکی نووسینی
عوسمان محەمەد ساڵح هەورامی

کوردستانی ڕەنگینمان ، سەراپا مەڵبەندی ئیلهام و چێژی بێوێنەی ئەشقی ڕاستەقینەی بێگەردە ، لە باوەشی گەرم و نەوموتۆڵی پڕ لە سۆزی بەرزیدا ، بە هەزاران ڕۆڵەی هەڵکەوتووی بەئەمەکی لێهاتوو سەریان هەڵداوە ... لەم مەڵبەندە هەمیشە بەهارەدا گەلێ شاعیری گەورەو بلیمەت بوونەتە پەروانەی ئەوینی نەبڕاوەو نەمری هەردوو دیدە گەشەکانی ... گەلێکیان لە بۆتەی خۆشەویستیی ئەم نازدارە ڕەسەن و ڕاستەقینەدا بە تەواوەتی جۆشیان خواردووەو ، لە جیهانی تایبەتیی بێئاگاییدا بوونەتە پریشکێ لە کڵپەی ئەشقی ڕاست و دروست و بێ گەرد ...

« سەودایی » یەکێکە لەو شاعیرانەی کە مەبەستی شەیدای پاك و بێگەرد ، بەتەواوی ئەپێکێ و ، خۆشبەختانە هۆنراوەی ڕەوان و جوانی بۆ کردووینەتە دیارییەکی خنجیلانە ...

**شاعیر لە چەند دێڕێکدا(*)**

ناوی شێخ ئیسماعیلی دۆڵان ـ ە ، لە ساڵی ( ١٨٤٢ ) دا ، لەدایك بووەو لە ساڵی ( ١٩٢٧ )دا کۆچی دوایی کردووە ... ئەم شاعیرەمان کوڕی شێخ حەسەنی کەس نەزان ، کوڕی شێخ حەسەنی کەس نەزان ـ کە بە شای کەس نەزان بەناوبانگە ، کوڕی شێخ حەسەنی خاوێ ، کوڕی شێخ عەبدولکەریمی خاوێ ، کوڕی شێخ ئیسماعیلی ولیان ـ کە بە غەوسی دووەم بەناوبانگەو برای زانای گەورە ، شێخ حەسەنی گڵەزەردەیە ، کوڕی شێخ محەمەدی نۆدێ ، کوڕی شێخ عەلی وەندرێنەی بەرزنجەییە ...

شێخ حسەین ـ شای کەسنەزان ، ئەم کوڕانەی لەپاش بەجێ مـــاون :

١ ـ شێخ حەسەن ـ باوکی شاعیـر

٢ ـ شێخ کەریم ، مامۆستای ڕێبازو تەریقەتی قادریە ، مامی شاعیرەوەو لە هەمان کاتا مامۆستاشی بووە ..

٣ ـ شێخ مەحیەددین محیدین ( موجتیددین )

٤ ـ شێخ عـەلی

٥ ـ شێخ محەممەدی یەگان ، قازیی سلێمانی بووە ،

بێجگە لە شاعیرمان ، شێخ حەسەنی کەسنەزان ئەم کوڕانەشی بوون ئێستا نەوەیان ماوە :

١ ـ شـێخ فـەرەج ،

٢ ـ شـێخ محـەمـەد .

٣ ـ شێخ حسەین . شاعیریش ئەم کـوڕو کچانـەی لە پاش بـەجێ ماون :

١ ـ شێخ فەتتاح ، لە سلێمانی ، لەو گردە نێـژراوە کـە بە نـاوی خۆیەوە ناوی دەرکردووە .

٢ ـ شێخ حـەسـەن .

٣ ـ سەید نـووری .

٤ ـ شـێخ طاهـر .

٥ ـ شـەمسەخان .

٦ ـ ئامینـەخان .

---

(*) ئەم چەند دێڕەم لە بەڕێز شێخ طاهر ـ کوڕی شاعیر ـ وەرگرت ، زۆر سوپاسی ئەکەم ..

ئێستا شێخ طاهـر و ئامینەخـان لە ژیانـدان •• کە شاعـیر کۆچـی دوایی کردووە ، شێخ طاهر تەمەنی شەش مانگ بووە •

بنەماڵەی شاعیر ، پشتاوپشت لەسەر تەریقەتی قاردریـە هاتوونەتـە خوارەوەو لە ڕێی تەکیەو خانەقاکانیانەوە گەلێ ڕێنمایی کۆمەڵانی خەڵکیان کردووە بۆ خواپەرستی و ئایینی پیرۆزی ئیسلامو دوور کەوتنەوە لـە هەموو کارو کردەوەیەکی ناپەسەند •

بەپێی خشتەی پشتاوپشتی بنەماڵـەی شێخانی دۆلان ، لـە دوای شاعیرمان ، بۆ دواجار ئەم ڕێبازو تەریقەتی قادری‌یە سپێرراوە بـە شێخ فەتتاحی کوڕی ••

لێرەدا جێی خۆیـەتی کـەمێ ژیانی تـەصـەووفی شـێخ ئیسماعیل بەسەربکەینەوە :

ساڵێوا هـەبووە سێ جار چلـەی کێشاوە ، دیارە چلـە کێشانیش لەجێی چەپەك و کل و گۆشەگیریدا ئەبێ ، کە پێی‌وتراوە خەلوەتخانە ، یا چلەخانە •• شاعیرمان لە شوێنی‌وادا چلەی کێشاوە ، کە ئێستـاش کەس ناتوانێ بە ڕۆژی تیدەڕۆ تیایا هەڵبکـا ، لەسەرێکـەوە لەبـەر دووری و چۆڵەوانـی ، لەسەرێکی‌کەشـەوە چلەخانانـە •• بەم‌چەشنـە ئـەم پیـاوە دوورەپەرێزە لە جیهانی ماددەو دنیاپەرستی ، هەموو ساڵێ چەند جارێ چل ڕۆژ ، لەم شوێنانەی خوارەوەدا ، بە دڵو دەروونێکی خاوێنو دوور لە هەواو فیزی ژیانی دنیاویستی ، چلەی خۆی کیشاوە :

١ ـ لای گوندی سەدو بیست •

٢ ـ دابلاخ ، کە لە شاخی بەراناتە •

٣ ـ ئەشکەوتی دۆڵانەقوولّ ، لە دۆلان •

هەر کاتێکیش لە خەلوەت دەرچووبـێ گەلـێ لە ناوداران چـوون بۆ سەردان و دیدەنی ، لەوانە ، شێخ مەحموودی نـەمر ، شـێخ قادری برای ، حاجی مستەفا پاشای یامولکی شێخ نەجیبی قەرەداخی ••

**ئامادەکردنی ئەم دیـوانە :**

لە کۆتایی مانگی تشرینی دووەمی ١٩٨٥ دا ، دۆستی بەڕێزم ، کاك سۆران مەحوی وتی : «شێخ طاهر دیوانی باوکی دایە لام کـە ئامـادەی بکەم بۆ چاپ ، بەڵام لەبەرئەوەی بەشێکی زۆری بە شێوەی هەورامییەو ، منیش کەمێك لە شێوەی هەورامی شارەزام ، دامەوە لای‌و ، یادی تۆمان کردەوە کە ئەم ئەرکە بەجێ‌بێنی .. پاش چەند ڕۆژێ لەگـەڵ دۆسـتی ناوبراوما چووینە دووکانەکەی شێخ طاهرو لەوێ بە دیداری شاد بووم‌و یەکتریمان ناسی و دەربارەی دیوانەکە گفتوگۆمان کرد .

دیوانەکە بـە خەتی کاك ستار فاتح نووسرابووەوە . ناوبراو لـە بنەماڵەی شاعیرە لە کۆتاییشدا سوپاسی مامۆستا حەمەئەمین زەنگی کردووە کە ئەرکی زۆری کێشاوەو دیوانـەکـەی لـە ڕێنووسی کۆن و خـەتی شکستەوە هێناوەتە سەر ڕێنووسی نوێ ..

پاش پیاچوونەوەیەکی زۆر بـە دەسنـووسی ناوبـراودا ، لـە ڕووی ڕێنووس ، ناوەڕۆك ، واتا ، لێکدانـەوە ، سـەرواو کێش ، پـاش‌وپێش کردن ، لابردن‌و کەم کردنەوە ، هەڵەی ڕوونوس کردنەوە ، ناتـەواویی زۆرم بەدی‌کرد .. لەگەڵ ئـەوەشا ، لـە هـەمان کاتا کـەڵکی زۆرم لێ وەرگرت و ماندووبوونی نووسەری زۆر پاش تیا بەدی‌ئەکرا ..

هەر لە هەمان کاتا شێخ طاهرم ئاگادار کرد ، کە ئەگەر بیانەوێ ئەم دیوانە ساخ بکرێتەوە و ئامادە بکرێ، زۆر پێویستە ئەسڵی دەستنوو سەکەی شاعیر ، یا دەسنووسی دێرینەی‌تر ، بە دەسـت بهێنرێـت .. بـەم‌چەشنـە شێخ طاهر کەوتە کۆشش تەقەلایەکی زۆر ، تا لـە ئـەنجاماو دوای دوو مانگێ کۆمەڵێ پەڕەی زۆر کۆن و نیمچە پواوی بەسەریەکـا دادووڕراوو هەڵوەشاوی بە خەتی شاعر پەیدا کرد ، ناوبەناو هەندێ لاپەڕەشیان تیایە بە خەتی شاعیر نەنووسراونەتەوە .. کە تکام لە شێخ طاهر کرد هەر هیـچ

ئەبێ هەموو ئەو دەسنووسانە پەیدا بکا کە لە بەردەست کاك ستار دا بوون ، بە داخێکی زۆر قووڵەوە دەستی بەدەستا داو ، وتی : « ئەم پیاوە بیرۆزە کتێبخانەی گەورە و دەسنووسی تایبەتیی خۆی هەبوون .. بەڵام هەزاران داخ ، کە ئەو کۆچی کردووە من منالێکی شیرەخۆرە بووم و تەمەنم شەش مانگ بووە .. ئا بەم چەشنە کتێب و دەسنووسەکانی بەڕەوازە بوون و چەندان ساڵە بۆیان وێڵم و دەستم نەکەوتووە .. »

بەڵێ ، دوای پەیداکردنی هەندێ لە دەسنووسی شاعیر ، کەوتمە تۆمارکردنی بەرهەمەکەی ، بەم چەشنەو دوای پیاچوونەوەو بەراوردکردنێکی زۆر لەگەڵ دەسنووسەکەی کاك ستاردا ، هەرچۆنێ بوو ئەم بەشەمان لە دیوانی شاعیر بەدەست هێنا . دیارە کار و رەنجەکەی منیش لە ناتەواوی و کەم کووڕی بەدەرنی یە ، بەڵام لە هەمان کاتا کەمتەرخەمی و درێغیم نەکردووە .

سەرەڕای هۆنراوەی بە شێوەی هەورامی و سۆرانی ، شاعیر هۆنراوەشی بە زمانی فارسی دارشتووە ، لە دەسنووسەکەی کاك ستارو دەسنووسەکەی خۆیدا کۆمەڵێ هۆنراوەی فارسی تۆمار کراون .

هەروەها لە دەسنووسەکەی کاکی ناوبراودا ، هۆنراوەی زۆر هەن کە لە ئەسڵی دەسنووسەکەدا بەرچاو ناکەون ، جا لەبەر هەمان هۆی کە باس کران تۆمارکردنیانم بە ڕاست و دروست نەزانی .. خوا یار بێ و رۆشنبیر و خوێنەری دڵسۆز بازووی لێ هەڵبکەن و ئەسڵی دەسنووسە کۆنەکان بەدەست بهێنرێن بەشی دووەمی دیوانی ئەم شاعیرەمان بەپێزتر و بەجێزتر ئەبێ ..

هەر هۆنراوەیەکیشم لە دەسنووسەکەی کاك ستار وەرگرتبێ ئاماژە ... ئیشارەت - م بۆ کردووە .

**نامەیەکی پایەبەرز مامۆستا مەلا عبدالکریمی مدرس و پەسەند کردنی دیـوانی سەودایـی ..**

دوای لێ بوونەوە لە ئامادەکردنی دیوانەکـە ، کـاك فاضـل کـوڕی شێخ طاهر ، وێنەی نامەیەکی مامۆستای پایەبەرز «مـەلا عبدالکریمـی مدرس » ی دامێ ، کە لە ڕۆژی ١٩٨١/١٢/٢٧ دا ، نووسیویـەتی بـۆ خوا لێ خۆش بوو مامۆستا کاردۆخی ...

لە بڕگەیەکا وای نووسیوە : « ئیمڕۆ دیوانی خوا لێ خۆشبـوو شێخ ئیسماعیلی دۆلاَنیم تەماشا کرد ، بەڕاستی بێتی ئەدەبی مەولـەوی بە دەماغم گەیشت ، وە زۆر حەیفە ئەشعاری وەها ون بـین .. » وە لـە نامەکەدا تکای لە مامۆستا کاردۆخی کردووە کە دیوانەکە ساخ بکاتەوە ، بەلاَم هەزاران ئەفسووس کە نەخۆشی و ئاکام بواریان نەداوە ئەو ئەرکـە جێبەجێ بکات ...

**ڕێبازی هۆنـراوەی**

لە هەلّدانەوەی لاپەڕەکانی دیوانی شاعیردا بۆمان ڕوونئەبێتـەوە ، لە چەند بوارێکا هۆنراوەی داناوە ، لەوانە :

**١ ـ دلّداری :**

وەکو سەرەتای بەشی زوربەی شاعیرەکانمان ، ئەمیش چاوی هەست وایکدانەوەی هۆنراوەی بە جوانی و شۆخی و لەنجە و چپـە و ژووان و ناز و نەزاکەتی کیژۆلّەی کوردەواری هەلّهێنـاوە ... دیـارە ئەمـەش مافێکی سروشتی و ئاساییو ڕەوای هەر شاعیرێکی لاوە کە ڕێبازی پاكو بێگەرد ئەگرێتەبەر و ، لە توانەوەیا لەتاو جوانی بێگـەردا ، هەسـتی بێخەوشی خۆی دەرئەبڕێ ...

## ٢ ـ ئاینــــی :

شاعیرمان له داوێنی پوختـەو خاوێنی بنـەماڵەیەکـی ئایینـی زۆر ناوداری کوردستاندا چاوی هەڵهێنـاوە ، لە هەمـوو کـاتو شوێـنو بوارێکیشا هێندەی چاوترووکاندنێـك بێ ئاگـاداریو سەرپـەرشتـیو ڕێنمایی نەبووە ••• یادی بێ گەردی کوورەی دەروێشـان ، هەیاهـووی سینەی سۆفیانی ساف ، ئاوازو سەدای قورئانی پیرۆز ، دابو نەریـتو زەویەی ئەڵقەی بابو مامو پیرانی تەریقەت ، ئەمانـەو زیاتریش کـاری گەورەیان کردۆتە سەر بەرنامەی ژیانیو لە ناخی دەروونـەوە هەمیشـــە هەژاندوویانە •• کەسێکیش بەمچەشنە پەروەردە کرابێ ، دیارە بە گیانی پڕ لە سەوداو ئەشقی پاکی یەزدانییەوە ئەفرێتە ناو گڕەی ئەشقی یەزدانیو تا هەتایە ڕەوانی نەمری هەمیشەو بە نەمری لە گەردشو سۆزی نەبڕاوەدا ئـەبـێ •

## ٣ ـ نیشـتمانی :

لەگەڵ سەرهەڵدانی بزووتنەوە کانی کوردستانی عیراقاو هاتنە کایە ومەیدانی شێخ مەحموودی نەمر ، وەك پێشەنگی بلیمەتو هەڵکەوتـوو ، لێهاتووی ئەو بزووتنەوانە ، ئاسۆیەکی زۆر پڕشنگدارو ڕۆشت سـەری هەڵدا •••

هەرچەندە لەو سەردەمەدا تەمەنی سەودایی زۆر لە هەوراز بووەو بە تەواوی پیری تەنگی پێ هەڵچنیوە ، لەگەڵ ئەوەشا لە خـودی شێـخ مەحموودی نەمردا هەمـوو ئاواتێکـی ورشـەداری دوارۆژی کـوردی بەدی کردووە ، وەکو هیمای خەبات و ڕەنجی گەلی کورد سەیری شێخـی نەمری کردووە و بە سۆزێکی زۆر قووڵو پاکـەوەو لـە چوارچێـوەی هۆنراوەی زۆر ڕەواندا هەستی بێ خەوش خـۆی دەربڕیـوە ••• دیـارە سەودایی لەو پایە بەرزەی خۆیدا ، وەکو پیری گەورەی تەریقەی قادریە

و بەسالاچوونی تەمەنێکی درێژ ، لەم بوارەی هۆنراوەدا ، بێجگە لە شادیی گەلی کورد هیچ مەبەستێکی‌تری نەبووە .

٤ ـ سروشت و جوانی :

بەڕاستی کوردستانی ڕازاوە و گەش و پاراو و شیرین و سازگار ، بووکێکە لە بووکە دانسقە نازدارەکانی ئەم سەرزەمینە بەرین و فراوانە ... بێ گومان شاعیری هونەرمەندیش بەر لە هەموو شەیداکان پەی بە ناخی جوانیی ڕاستەقینەی ئەم نازەنینە ئەبات و ئەبێتە پەروانەی هەمیشەیی ...
لەم ڕووەوە « سەودایی »ش دڵبەندی ڕاستەقینەی ئەم لایەنە بووە و چەندی لەدەست هاتبێ ، سستی نەکردووە و تابلۆە ڕەنگین و قەشەنگی دارشتووە ...

٥ ـ کۆمەلایەتی :

هەرگیزا و هەرگیز نابێ و ناکرێ شاعیر لە بەرەی کۆمەلانی خەلکی ڕەش و ڕووت دوورەپەرێز بێ و گوێی خۆی بئاخنێ ... ئەوەتا ئەم شاعیرەشمان لەم ڕووەوە هیچ کەمتەر خەمی نەکردووە ، بەتایبەتی لە چەرمەسەری و ئاهە و نالە و هاورا و برسێتی و مەرگی بە کۆمەڵی سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهان ، شاعیرمان تابلۆیەکی بالای بۆ تۆمار کردووین و لایەنێکی وردی مرۆڤانەی بۆ پارا ستووین ..

خوێنەری بەڕێز ، دیارە ئەم چەند دێڕەم بە کورتی نووسین بۆ هەر لایەنێکی هۆنراوەی شاعیر نموونەم تۆمار نەکردووە ... ئەمەیانم هێشتەوە تا خوێنەر بۆ خۆی لە دەقی دیوانەکەدا سەرنجی ئەو لایەنانە بدات و لە سەرێکی کەشەو ئەو نووسەرە بەڕێزانەی ویستیان تۆژینەوە و لێکولینەوە بنووسن ، با ئەمانیش بە لێکدانەوەی وردی خۆیان بۆ مەبەستی خۆیان بگەڕێن ... گومانیشی تیا نییە کە پێناسەی شاعر وا لە

تویێ بەرهەمەکەیا ••• ئەمە دیوانەکە و ئەوە تۆی بـەڕێزیش ، هیوادارم جێی خۆی بگرێ و ڕەوانی شاعیرمان بەم بەرهەمەی شاد بێ •••

**لە میانەی مەولەوی‌و سەودایی‌دا :**

لە بەشی هۆنراوەکانی شێوەی هەورامیدا ، زۆر بەڕوونی‌و ئاشکرا کاری ڕەوانی مەولەوی لە تویێ زوربەی هۆنراوەکاندا دیارە ••• من بۆ خۆم کە بۆ یەکەم جار بە دیوانەکەدا چوومەوە لە زۆر شوێنا وام هەسـت ئەکرد کە لەگەڵ هـەست و هۆنراوەی مەولـەویدا گـەشت ئـەکەم ••• چەند کەسێکی تریش کە هەمان کۆمەڵە هۆنراوەیان خوێندەوە ، هەر هەمان هەستیان دەربڕی ••• کاتێکیش نامەکەی بەڕێز مەلا «عبدالکریم مدرس»م خوێندەوە ، کە بۆ خوالێ خۆشبوو مامۆستا کاردۆخی نووسیبوو ، زۆرم پێ خۆش‌بوو کە بۆچوونەکەم لەجێی خۆیایەتی •••

گومانی تیا نییە هۆی ئـەم کار تێکردنـە بـە شێوەیـەکی سـەرەکی ئەگەڕێتەوە بۆ کاری ڕاستەوخۆی هۆنراوەی مەولەوی لە سەر هەسـت و سۆزو ڕێبازی هۆنراوەی سەودایی ••• لە سەرێکی کەشەوە قوتابخانەی بەرین‌و فراوانی هۆنراوەی مەولەوی بەشێوەیەکی گشتی ، نەك هەر کاری لە تویێی هۆنراوەی سەودایییدا هەیە ، بەڵکو ئەم کارتێکردنە لە هۆنراوەی زۆر شاعیری تری سەردەمـی مەولـەوی و دوای مـەولـەویشا ئاشـکرا بەرچـاو ئەکـەوێ •••

کاتێکیشی سەودایی لەو هەڕەتی گوڕی لاوێتیا نامەی پڕ لە تاسە و سۆزی بێ‌گەردو بانگهێشتن و میوانداری ئەنووسێ بۆ مەولەوی ، ئەمـە بەڵگەیەکی گەورەیە بۆ جێی بەرز و ڕێـزی زۆری مەولـەوی لـە دڵی سەوداییدا ••• نابێ ئەوەش لەیاد بکەین کە سەودایی « ٣٦ » سی و شەشی ساڵ دوای مەولەوی « ١٨٠٦ ــ ١٨٨٢ » هاتۆتە ژیانـەوە ••• کاتێکـیش

مەولەوی کۆچی دوایی‌کردووە ، تەمەنی سەودایی « ٤٠ » چل ساڵ بووە ..
لێرەدا ئەوەمان زۆرتر بۆ ڕوون ئەبێتەوە کە لە گەرمەی لاوێتی و گوڕی ژیانیا ، سەودایی لە سەرچاوەی سازگار و ڕوونی قوتابخانەی بڵندپایەی مەولەوی بەهرەی خۆی وەرگرتووە ...

وەڵامەکەی مەولەویش بەڵگەیەکی گەورە و پتەوە بۆ پایەی بەرزی ئایینی و شوێنی دیار و تایبەتیی سەودایی لە جیهانی هۆنراوەی فراوانا ...

**بۆچی سەودایی بە شێوەی هەورامیش هونراوەی نووسیوە ؟ :**

پرسیارێکە و خۆی سەر هەڵئەدا ... بە لای منەوە ، لە سەردەمی لاوێتی شاعیرمانا زوربەی دەسنووس‌و بەیازە کوردییەکانی بەردەست بە شێوەی هەورامی بوون ، بێ‌گومان کتێبخانەی بنەماڵەی شاعیریش پڕ بووە لەم دەسنووسە نایابانە .... ئەمە سەرەرای پێوەندی گیانی و ڕەوانیی زۆر پتەوی میانەی سەودایی‌و مەولەوی ، لە سەرێکی‌کەشەوە پێوەندی زۆر پتەوی شاعیر لەگەڵ شێخ عومەری بیارەدا کارێکی زۆری کردووەتە سەری و زۆرتر حەزی کردووە بە شێوەی هەورامی هۆنراوە دابنێ ...
ئەمەش لە دەقی ئەو هۆنراوانەدا دەرئەکەوێ کە سەودایی بۆ شێخ عومەری بیارەی نووسیون .

شایانی سەرنج و تێبینیشە ، ئەو هۆنراوانەی بە شێوەی هەورامی دایناون گەلێ لەو هۆنراوانەی بەهێزتر و خەستترن کە بە شێوەی سۆرانی دایناون . بە لای منەوە هۆی ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە شاعیرمان زۆرتر هەڵس‌وکەوت‌و خوێندنەوەو مامەڵەی ئەدەبی‌و هۆنراوەی ، بە شێوەی هەورامی بووە .

**چاو تێری و دەروونبەرزیی سەودایی :**

**شێخ طاهر بۆی گێڕامەوە :**

× شێخ مەحموودی نەمر بە میوانی چووە بۆ دۆلاّن ، پێشنیاری کردووە کە گوندی دۆلاّنی بۆ بکڕێ و بە مولکایەتی ببێ بە هی خۆی ، بەلاّم لەبەر نەویستنی پارە و پایە و دنیا ، داویەتە دواوە .

× لەو ماوەیەدا کە مێجەرسۆن فەرمانڕەوای سلێمانی بووە و شێخ مەحموودی نەمر پلنگ ئاسا پەلاماری داگیر کەرانی داوە ، مێجەرسۆن سەر لە دۆلاّن ئەدات و داوا لە سەودایی ئەکات سەر لە سلێمانی بدات بۆئەوەی مووچەی بۆ بڕێتەوە ... بەلاّم سەودایی ناڕوا ، دوایی مێجەرسۆن نامەیەکی بۆ ئەنووسێ و داواکەی دووبارە ئەکاتەوە ، سەودایی هەر وەلاّمیشی ناداتەوە ، لەئەنجاما مێجەرسۆنی ، فەرمانڕەوا و نوێنەری ئەو ئیمپراتۆریەتەی کە خۆر لەسەر خاکی ئاوا نەئەبوو ، فرۆکە ئەنێرێتە سەر گوندی دۆلاّن و بوردمانێکی زۆر خەستی ئەکەن و ئەیسووتێنن .. یەکێ لە پیاوە دلێرەکانی گوندەکە ڕووی کردبووە شێخ ئیسماعیل و ، وتبووی : بەس نەبوو جەنابت نەچووی بۆ سلێمانی و تووشی ناهەمواری و زەحمەت نەبووی !! ئێمەش ئەمڕۆ و سبەینێ گوندەکەمان دروست ئەکەینەوە ...

× ناسرەدین شای قاچار ـ شای ئێران ـ نامە ئەنووسێ بۆ شێخ کەریمی کەسنەزان ، پێشنیار ئەکا کە مروچەو بەرات بڕێتەوە بۆ تەکیە و خانەقایان ، ئەمیش بۆ وەلاّمی نامەکە سەودایی ڕائەسپێرێ ... سەودایی ئەلێ : مامە گیان بێخەم بە دڵو هەستو دەروونی هەردووکمان هەر یەکە ...

لەوەلاّما بۆی ئەنووسێ : تۆ شا و شازادەی ، پیش وەکو تۆ شازادەم و کوڕی شاحسێنی کەسنەزانم ، ئێمە بە نانی دەروێشیی خۆمان قایلین و هەڵئەکەین ..

**پایەی سەودایی لای شێخ مەحموودی نەمر :**

وەك ڕوونكرایەوەو لە هۆنراوەكا تا زۆرتر ئاشكرایە ، شێخ مەحموودی نەمر لە دڵو هەناوی سەوداییدا شوێنی زۆر تایبەتیی خۆی هەبووە •• بە هەمان دەستوور شێخی نەمریش ڕێزی تایبەتیی لە سەودای گرتووە و زۆری خۆش ویستووە •

مامۆستا مەلا عەلی سەنجەری بۆی گێڕامەوە ، وتی ، كاتێ كە شێخ مەحموودی نەمر لە هیندستان گەڕایەوەو هاتەوە سلێمانی ، لە هەموولایەكەوە دەستە بەدەستەو پۆل‌پۆل گەورەپیاوان و ناوداران ئەهاتن بۆ بەخێر هاتنەوەی شێخ و دەربڕینی شادی‌و بەختیاری ، كاتێ كە شێخ ئیسماعیلی دۆلان هات بۆ بەخێرهاتنە وەو دیدەنیی شێخ مەحموود ، شێخی نەمر زۆر بە تاسەو شوقەوە چوو بەپیریەوە و پێشوازییەكی زۆر گەرمی لێ كرد •••

بەڕاستی ڕاستە وتراوە : دڵ ئاوێنەی دڵە •••

**عوسمان هەورامی**

**سلێمانی ١٠-٧-١٩٨٦**

# بەناوی خوای بەخشندە

زنجیرەی تەریقەتی قادریەی بنەماڵەی شێخانی دۆڵان(*) :ـ
ئەم تەریقەت و ڕێبازە لە یەزدانی گەورەوە بە دیاری هاتووە بۆ پێغەمەری مەزنمان محەممەد ( د.خ ) لەوەوە بۆ ئیمامی عەلی ـ شێخ حەسەنی یەسری ـ شێخ حەبیبی عەجەمی ـ شێخ داوودی طائی ـ شێخ مەعرووفی کەرخی ـ شێخ سەری سەقطی ـ شێخ جونەیدی بەغدادی ـ شێخ ئەبووبەکری شیبلی ـ شێخ عەلی هەکاری ـ شێخ عەبدولواحیدی یەمانی ـ شێخ یوسفی سەرطووسی ـ شێخ محەممەد سەعیدی مەخزوومی ـ شێخ عەبدولقادری گەیلانی ـ شێخ عەبدولڕزاق ـ شێخ عەبدولفەتاح ـ شێخ محەممەد قاسم ـ شێخ محەممەد ساذق ـ ـ شێخ محەممەد غەریب ئەڵلا ـ شێخ حوسەینی بەسرائی ـ شێخ موحیەدینی قوولەی کەرکووکی ـ شێخ عەبدولصەمەدی گڵەزەردە ـ شێخ حوسەینی قازانقایە ـ شێخ قادری قازانقایە ـ شێخ کەریمی کەسنەزان ـ شێخ ئیسماعیلی دۆڵان ...

**پێزانین و سوپاس**

زۆر سوپاسی کاك عوسمان
هەورامی ئەکەین کە ئەرك و
ڕەنجی زۆری کێشا بۆ
ئامادە کردن و ساخ کردنەوە و
پێشەکی نووسینی ئەم دیوانە ...

**شێخ طاهر کوڕی شێخ ئیسماعیلی**
**دۆڵان**
**سلێمانی ١٩٨٦/٧/٢٦**

---

(*) ئەم زنجیرەیەم لە بەڕێز « شێخ طاهر شێخ ئیسماعیلی دۆڵان » وەرگرت و لە سەر داخوازیی ئەویش تۆمارم کرد ، بۆئەوەی هەرکەس بیەوێ لەم زنجیرەیە بکۆڵێتەوە ، ئەم سەرچاوەیە لە بەردستیابێ ..

# پیتـــی

- ١ -

## پیتی

**ـ آ ـ**

ئازیر جــه دووریت دیده پــڕ هونــم
مــەشنــەوان یاران کزەی دەروونــم[١]
وەختەن جــه دووریت بوام وه قــەقنــەس
بەرشــۆ جه قەفەس هەناســەو نەفــەس[٢]
پــەریٚ دیــدەنیت دەروون پــڕ دەردم
دوور بــۆ جــه باڵات هــەناســه سەردم[٣]
دیدەم جــه دووریت دەریاچــەی هوونــەن
ســەرم سەرگەردان ، دڵ تووناى توونەن
حەیفــەن پەریٚ تــۆ شاى وەفاداران
وێــڵ وام چــوون مەجنوون ڕوو ئــەو کۆساران
یــا وه شــەرارەى هیجران و فیراق
**نگوونَ ئـه گێجاو تاقـەتَ بــۆ تاق[٤]**

---

(١) مەشنەوان : ئەبیستن
(٢) بوام : ببم : بەرشۆ : دەرچیٚ ، جه قەفەس : له قەفەزی سنگ ٠
(٣) پەریٚ : بــۆ ٠
(٤) شەرارە : برووسکه و گڕ ٠ نگوون نەگێجاو : نوقم له گێژاوا تاقەت : ئارام ٠ ببۆ تاق : لێك بێتەوە ، شەق بەریٚ ٠

نەك وە بڵێسەی دووریت سۆزان وام
یا داخڵ وە سیلك شێخی صەنعان وام

- ٢ -

ئازیز بۆی نامەی دەروونی پڕداخ •
بۆپڕووزی جەرگ دا نە ڕووی دەماخ[١]
شادیی ڕ نازداران ، شنۆی نەوهالان
خرنگەی یاتاخگەی نازك خەزالان[٢]
گرنج ئەگریجات وە گولاوەوە
پەخش ونەخش نە پای کەچ کلاوەوە[٣]
گۆنای گولناری گولان بێزەوە
مەر پرشەی پەروین یا پەروێزەوە[٤]
سیمای سیمی ساف خەیاتەی بێ گەرد
ئاوێزان وە داو لای گەردەنی زەرد[٥]

---

(١) بۆپڕووز : بۆسۆ •
(٢) شنۆ : شنه • نەوهاڵ : نەونەمام • یاتاخگە : بارگە خەزالات : ئاسکەکان
(٣) گرنج ئەگریجان : ئەگریجە لوولەکان • پەخش ونەخش : بڵاوو جوان ڕەنگین • نە پای چ کلاوەوە : لە دامێنی کلاوی لارا •
(٤) گوڵناری : گوڵ هەناری • گوڵنار : جۆرە هەنارێکە ، بە تۆپەڵ گول ئەکا و هەڵیان ناپێچێ ، مەر : مەگەر • پرشەی پەروین : ورشەی ئەستێرەی پەروین ، یا پەروێز ەوە : یا ورشەی تاجەکەی خوسرەوی پەروێز •
(٥) سیما : شێوە ، سیمی صاف : زیوی پاك خەیاتە : مەبەستی تاڵی زوڵفی یارە •

عەرعەر قامەتان پەروەردەی جۆی ناز
جەلادان جەمین پەی سۆزو گوداز[٦]
جە لەهجە و لەنجەی سەرپەنجە ئالان
بەیان بوینان پۆلی نەوهالان[٧]
جە شەفافی شەوق شێوەی خاڵخاسان
کەرتو پەرت مەبی دڵان وەئاسان[٨]
زێلەی زلزلەی سازو سۆزی نەی
زرنگەی زەنگڵەی زەڕ ، وەیوەی جە بۆی بەی[٩]
پرشەی پاژنە و پا و پاوانە و خرخاڵ
لەرزەی سەد تەرزەی سەرلفکە و دەسماڵ[١٠]
بەرقو بریقەی باهووبەندو باڵ
خڕەو خڕخشتو خرنگەی دانەو لاڵ[١١]

---

(٦) عەرعەر قامەتان : باڵا عەرعەرەکان • جۆی : جۆگەی • جەلادان جەمیت : ڕوومەتیان دەرخست • پەی سۆزو گوداز : بۆ سووتاندن و برژاندنی شەیدایان •

(٧) لەهجە : چپەی ناسك • بەیان بوینان : بێن بیینن • دروستیشە بۆ وشەی ( بەیان ) بڵێین بە واتای بەهێکان ، واتە مەمکەکان ، یا بە واتای شەفەق ، دێ •

(٨) جە شەفافی : لە ناسکی • مەبی : ئەبوو •

(٩) زێلە : قریوەی شایی • زلزلە : خشڵ • زەڕ : زێڕ • جە بۆی بەی : لە بۆنی بەهێی سینەی نازداران •

(١٠) سەد تەرزەی : سەر چەشنەی ••• لفکە : پارچە قوماشێکی جوان بووە، بەتایبەتی کچان بەستویانە بە کڵاو و فێستەکانیانەوەو بەسەر شان و پشتیانا شۆڕ بووەتەوە ••• دەسماڵ : دەبستەسەر ئاوریشم ••• لفکە و دەسماڵ بۆ سەرپێچ بەکارهێزاون ، گولنگە و ڕێشوویان بەملا و بەولا و بە سەر شان و پشتا بڵاو بوونەتەوە ••

(١١) باهووبەند : بازووبەند ••• لێرەدا مەبەست بازن و خرخاڵی قۆڵ و مەچەکی ئافرەتە ••• خڕە ، خڕخشت ، خرنگە : دەنگی لەرینەوەی خشڵ •• دانەو لاڵ : مرواریو لەعل ، مەبەست ئەو خشڵەیە ئافرەتەکان لە خۆیان داوە •••

زەردیی زەردەبــەی وەی گشـت جــەلاوە
مــەلەریا نــە تــۆی تورمەو تــەلاوە[12]
شـنیای شــەدەمی شــەنگ وە شـنۆی شەماڵ
شــادیی نازداران ، جــەلای خەتو خــاڵ[13]
کـۆرپــە نازاران ، نازەنین نــازان
جــە ڕووی نازەوە مــەکەردن ڕازان
داخ وە بانی داخ دەردی نادیاری
نادیاریی تــۆ دەردم کـــەرد کاری
وەی کـزەی دەروون ، وەی گشت زامــەوە
یاران کەردن کـۆچ ، مــن هــەر مامەوە[14]
نمەز چــەرخی چــەپ چەواشــەی کەچڕام
وە کامین زامــەت مەویەرۆم جە نام !![15]
وەرنــە مــەویا وەخت شــادیی نازداران
وێڵ وام وێنــەی قەیس ڕوو ئــەو کۆساران[16]

---

(١٢) مەلەریا : ئەلەریبەوە ٠٠ تورمە : کۆڵوانە ٠٠٠ تەلا : زێڕ ٠٠٠
(١٣) شنیای شەدەی شەنگ : شنینــەوەی مشکــی و شـــەدەی جــوان ٠٠٠
چەلای : نواندنی ، دەرکەوتنی ٠٠٠
(١٤) مەولەوی زۆر جوانی فەرمووە :
یاران وێنەی صاق مــەی ، وەکامــەوە
ویەردن چوون دورد هەر من مامەوە
واتە : دۆست و هاوڕێ و یاران ، وەکــو شەرابــی پــاك ، ڕۆیشتــن و کۆچیان کرد و بە ئاواتی خۆیان گەیشتن ، تەنیا هەر من وەکو خڵتەی بنی کووپەی شەراب ماومەتەوە ٠٠٠ بڕوانە : مەلا عبدالکریمی مدرس ، دیوانی مەولەوی ، ل ٢ ــ ٣ چاپی ساڵی ١٩٦١ ٠٠٠
(١٥) نمەز : نازانم ٠٠٠ چەرخی چەپ : گەردوونی کەچڕەو ٠٠ کــەچڕام : بێسۆزو بێڕەحــم ٠٠ وە کامیــن زامــەت : بە کــام دەردەســەری ٠٠ مەویەرۆم جە نام : لەناوم ئەبا ٠
(١٦) وەرنە : ئەگینا ٠٠ مەویا : ئەبوایە ٠٠ وێڵ وام : وێڵ بوومایە ٠٠٠

## - ٣ -

ئـەر بـۆپـڕووزێ وەدەم[*] دەردەوە
ڕوێوە ڕووکەرد ئەوڕووی هەردەوە[١]
بناسەش ، سۆزەی عەمۆنی زوخاڵیـت
بناسەش ، سۆزەی عەمۆنی زوخاڵیـت
مەر مامۆت ئەوسا دەماخ کەرۆ چـاخ
بگێرۆ ئازیز وارگەکەی ئێلاخ[٢]

---

(*) لە کاتێکا کە شێخ قادری شێخ کەریمی کەسنەزان بۆ هاوینەخـۆری چورە بۆ هەورامانی ئەودیو ، سەودایی ئەم هۆنراوەیەی بۆ نووسیوە ·

(١) ئەر : ئەگەر · بۆپڕووز : بۆسۆ · ڕوێوە : ڕۆژێکیان ·

(٢) مەر : مەگەر · وارگەکەی ئێلاخ : هەوارگە کوێستان ·
هەر کاتێ ئازیز خۆشەویستەکەم گەیشتـە هەوارگـەی کوێستـان ، ئەوسا دڵی مامت بێخەم ئەبێ ·

ئازیز شـادی شـی ، بنمانـە بالآ
سینەم کەر وە تێخ مەینەت یەکـالآ[1]
بدیە تا هوونـەی هـووناوەکـەی دڵ
چون چێش جاری‌یەت زوخاوان وەکۆڵ[2]
سەیلی ئەسرینم گۆل بەسـتەن وەتـاو
مدۆ وەهەمدا هوونـاوو زوخـاو[3]
نووری بینایی عەممـوی حەزینـت
سەرشێتم کەردەت ئارەزووی دینـت[4]
بڵێسەی هەستیم هەر ڕۆ سـەد تـەرزەن
تاڵی تای حەیات پڕ بیـم و لـەرزەن[5]

---

(*) ئەم هۆنراوەیەی بۆ بەڕێز شێخ کەریمی مامی نووسیوە .... لەبەر پیوەندیی گیانی و خۆشەویستیی بەتین ، هەر بە وشەی (مام ، مامۆ ، عەحمو ) یەکتریان بانگ کردووە ..

(١) شی : ڕۆی بەسەر چوو . بنمانە : بنوێنە . نازدارەکەم ، من شادیـم نەماوە ، سا تۆ بالآت بنوێنە ، با خۆشی بکەوێتە سنگمەوە ، کە بـە تیخی بەلآ و خەم هەلاهەلا بووە ،

(٢) بدیە : بڕوانە .

(٣) سەیلی ئەسرینم : لافاوی فرمێسکم . گۆل بەستەن : گـۆلی بەسـتووە مدۆ وەهەمد : ئەدا بە یەکا ـ لافاوی فرمێسکم پەنگـی خواردۆتـەوە و خوێناو و زوخاوم تێکەڵ بە یەك بوون .

(٤) ئەی ڕووناکیی بینایی مامی خەمبارت ، من بۆ دیدەنیی تـۆ وا سـەر شێـت بـووم .

(٥) هەستیم : بوونم . هەر ڕۆ : هەموو ڕۆژ . سـەر تەرزەن : سـەد جۆرە . پڕ بیم : پڕ ترس . لەبەر دووریت ، هەر ڕۆژەی بە سەد جۆر کڵپە لە بوون و هەناوم هەڵئەستێ و تاڵی بایکـی ئـاوات وژینیشـم هەمیشە پڕ ترس و لەرزە و هەڵ ئەلەرزێ .

یا بەیۆ سەدات وەش وەش نە گۆشم
بێ تەراتە و ساز بەرز بۆ خرۆشم[٦]
پەی خەیاڵی بیکر فیکرەکەی عالیت
سفتە سۆزانەت عەمموی زوخالیت[٧]
تای خەیاڵ کاڵ کاڵ بڕیا وەهەمدا
**پلووسکەی سێلاو ئاما وە چەدا[٨]**
زڕەی زەنگڵەی زەڕ بازی بەندی ئەو
کاڵای باڵای لاو ، خاڵی ڕەندی ئەو[٥]
دەستەی پیرۆزەو مرواریو مەڕمەڕ

---

(٦) با بەیۆ : یا بێ ـ سەدا : دەنگدانەوە ، لێرەدا بە مەبەستی دەنگ هاتووە ـ وەش وەش : خۆش خۆش ـ نە گۆشم : لە گوێم • تەراتە : بەستە و گۆرانی ••• با دەنگە پڕ سۆزەکەت خۆش خۆش بێتە گوێم ، ئیتر بێ بەستەو سازود گۆرانی هەموو بوونم دێتە خرۆش •

(٧) پەی : بۆ • بیکر : تازە و پاراو • عالی : بەرز ، باڵا • سفتە سۆزان : سووتاو •• بۆ بیر و ئەترێشەی نوێ و پاراوت ، لێکدانەوە و هۆشی بەرز و باڵات ، وا مامت سووتا و هەڵقرچاو ، بوو بە خەڵووز •

(٨) سێلاو : لافاو ••• تاڵی ئەندێشە و خەیاڵم تاڵ تاڵ پچڕاوەو تێکئالاوە ، لافاوی فرمێسکی چاوەکانم وەکو پلووسك بە چاوما دێتە خوارێ •••

(١) وەش دەماخ : بەکەیف و دڵخۆش ، مەنحانی : ئەنوێنی • نازدارەکەم ئەمڕۆ زۆر بەکەیفو و دڵخۆشی ، تۆ گیانی منی و بگرە لە گیانم گیانتری و گەلێ بەنرختری ••• لە دوای ئەم دێڕە ئەم دێڕەی خوارەوە هەیە کە نیوەی دووەمی کوژاوەتەوە و دیار نیە :

وە ڕەنجەی گرنج ئەو پەرچەم چین چین ماتم کەزد •••

(٢) ئایتە : ئاوێنە •

(٣) حەمایل : خشڵی سنگ و بەرۆکی ئافرەت •• ئەشکرێ بۆ بەهێی سینە بێ •

(٤) شاهوو ، شاهۆ : شاکۆ ، چونکە لە هەموو کێوەکان وشاخەکانی ناوچەی خۆی گەورەتر و فراوانترە ، چوانترین ناوچەیە کەوتۆتە پشت شاری پاوەوە • باهوو : قۆڵ • ئاهو : ئاسك •

(٥) زەڕ : زێڕ • یازی بەند : بازنی زێڕ ، یا زیو ، ئەکرێتە قۆڵ و مەچەك ، بازووبەند ڕەتد : جوان و بێگەرد •

هـەر هارەوی مەیۆن زێڕی تاسـی زەر[٦]
بریقـەی نقێـم نگینی پـەنجـەی
مـەلایك مایل وە لەهجە و لەنجەی[٧]
سـیمای سـیمی زولف لـوول داوەن وە لاف
بییـەن وە سـەیوان سـای گەردەنی ساف[٨]
شـەماڵ خەیمـەی خاڵ ، تاڵ تاڵ هەڵداوە
وە سـای گـەردەنی زەردی ئـالاوە
دیام زەردیی گـرد ، های های بـەدبەختان
یانـەم وێران کەرد ، گرد کەردم سـفتان[٩]
سـیوای ئـەو یاران جـەی مـەکانـەدا
یـەکێ دڵ بدۆ وەی پـەیکانـەدا[١٠]
دڵـەی پـەڕەی گوڵ هـەر ئەمەند چڵ دا
ئـەم چەم لـەو چەمدا ، ئەو چەم لەم چەمدا[١١]

---

(٦) مەیۆن : دێت : تاسی زەر : تاس‌کڵاوی زێڕ .
(٧) وە لەهجە : بە گفتوگۆی شیرین .
(٨) سیما : شێوە . سیم : زیو . سەیوان : چەتر ... بە شیوەیەکـی وا جوان و ڕێك و پێك زیـوی سـەر و ، زولـفی ڕێـك خستـوون ، کـە بوونەتە چەتری گەردنی ساف و جوان و بێ‌گەردی .
(٩) دیام : سەیرم کرد . گرد : گشت . سفتان : سووتاو ... کەسەرنجی رەنگ زەردیی هەموو بەدبەختەکانم دا ، بەجارێ ماڵـم وێـران بـوو ، سەرابا ئاگرم تێ بەربوو بۆیان .
(١٠) سیوا : جگە ـ جەی مەکانەدا : لەو شوێنەدا . بە ، کـێ : ئەمە کێبـە بدۆ بدا . پەیکان : تنیر ، بێجگە ئەو یارانە ، کێ هەیە لـەم شوێنـەدا دڵی خۆی بکا بە نیشانەی تیر و پەیکان !
(١١) وشە ( چڵدا ) سەروای هۆنراوەکە لەنگ ئەکا ، ڕەنگە وشەیەکی تـر بێ بەپەریەوە ، وشـەی ( چەمـدا ) دا بـێ . وشـەی چـەم : بـە واتای چـاو هـاتووە .

هەر سەرچەمەی چەم لە چەم چل چەم بی
هەر چەم بی تا چەم ، هەر چل چل چەم بی[١٢]
چەمەی چەم جمان ، وشکاوش مەند بی
هەر ماما و مەشی .... چەند بی[١٣]
هەر بەند سەیلی هەرس جە حەسرەت ڕێزا
نە جۆی سەرچەمەش گەردەلوول خێزا[١٤]
پەی دینی جەمین ئارامەکەی جان
**چوون چکەی جگەر چکیا ، چوون جمان[١٥]**
سەودایی ـ سەرئێل گشت بەدبەختانی
جە بەدبەختیی وێت چ سەرسەختانی[١٦]
**وشکاو ئاوەردەن جۆی چەمەی زەینم**
نەزر و فتووشەن بینایۆو عەینم[١٧]

---

(١٢) سەرچەمەی چەم : سەرچاوەی چاو · چل چەم بی : هەر یەکە بوو بە چل چەمی فرمێسك ·

(١٣) جمان : جوولاوە ، بۆشاییەکە کوژاوەتەوە ·· ماما و مەشی : ئەهات و ئەچوو ·

(١٤) بەند : ئەوەندە · سەیلی هەرس : لافاوی فرمێسك · خێزا : هەستا ·· لە عەزرەتا ئەوەندە لافاوی فرمێسکی بەخوڕ بەرپا چوو ، هەر لە سەرچاوەوە گەردەلوول و گێژە لووکەی توندی هەستان ··

(١٥) پە دینی جەمین : بۆ دیداری ڕوومەتی · چون چگەر : وەك چکەی خوێنی جگەر · چون جمان : هەرەس هێناوە و جماوە ·

(١٦) جە بەدبەختیی وێت : لە بەدبەختی خۆت ·

(١٧) وشکاو ئاوەردەن : وشکاوی هاتووە ··· زەینم ، ذهنم : بیر و هۆشم ··· نەزر و فتووشەن : نەزر و فتووحیەتی ، خێر و سەدەقە ئەکات ·· بینایود عەینم : بینایی چاوم ··· جۆگە و سەرچاوەی هۆش و بیرو لێکدانەوەم وشکاویان هات ، بینایی چاوەکانیشم خێرو سەدەقە ئەکەن بۆئەوەی بە دیدارت شاد ببنەوە و هێزو توانای بینینیان لەدەس نەچێ ·

دڵ ئیمجار جه نۆ بوینۆ باڵات
یەریاد بۆ خەمان وە شنۆی کاڵات[18]

---

(١٨) بوینۆ : ببینێ ، ببینێتەوە ... بەربـاد بۆ خەمـان : خەمەکـان بـەبا ئەدرێن ... ئەگەر بێت و خوا بکات جارێکی‌تر دڵم بە بینینی باڵات شادبی و ، چاوم بە ڕەوتی پڕا شنە و شنینەوەی بەرگی دلگیرت بکەوێتەوە ، هەرچی خەم هەیە هەمووی ئەدرێ بەبادا ...



ئازیز وەش دەماخ ئـەمڕۆ مەنمانـی
گیانی من جە گیان ، گیان ، گیان[1]
عەکسی ئاینەی ئەگریجـە و خـاڵان
تاڵات کەرد کـاڵای بـاڵای گـوڵاڵان[2]
حەمایـل جە بان سینـە شـەڕ دەکا
موژەی چەم وەهوون چگەر تەڕ دەکـا [3]
دەماخ وە نەشئەی بەزمی شاهووی ئـەو
خرنگەی خۆخاڵ باهووی ئاهووی ئەو[4]

ئـەی نەفسی سـەرکەش ، گومڕای(*) بێ کەماڵ
وەس خەیاڵی خام باور وە خـەیاڵ(١)
خـەیاڵی فاسـد بـەس باوەر وە دڵ
وە هـەوای بێسوود وەس وێت کـەر خجڵ(٢)
تـا کـەی بێزاریت جـە دین و تاعـەت
جە بەدئەتواری کـەی مشۆت تاقەت(٣)
مـەر لێلاییتـەن ، نـەدیـەنت یاران
چـەندێ کۆچ کـەردەن تاسەر هەواران(٤)
کەردەی تاکەردەت سـەد هـەزار تـەرزەن
تەپڵی بـەد نامیت جـە عالـەم بەرزەن
هـەوای جوانیت بـەرشی جـە دەماخ
هابیت وەهام باف ناڵەو ئـاخو داخ(٥)

---

(*) لەم هۆنراوەیەدا شاعیر سەرزەنشتی خۆی ئەکا .
(١) سەرکەش : سـەرکێش ، یاخی . بێ کـەماڵ : بێهۆش‌و بـێمێشك .
خەیاڵی خام : بیر و ئەندێشەی خاوو هیچو پووچ — باورە : بێنە .
(٢) وەس وێت کەر خجل : بەس خۆت بخلافێنە و خۆت خەریك بکە .
(٣) جە بەدئەتواری : لە بەدرەفتاری ، لە هەڵس‌وکەوت‌و کردەوەی ناشرین ؛
کەی مشۆت : کەی ئـەچێت .
(٤) مەر : مەگەر . نەدیەنت : نـەت‌دیوە .. بۆچی ، مـەگـەر کوێرابیت
داهاتووە و ئاگادار نیت کە چەندان یاران ، کۆمەڵ کۆمەڵ بـەرەو دوا
هەوارگە کۆچیان کردووە .
(٥) هەوای جوانیت : ئارەزووی سـەردەمی لاویت . بـەرشی : دەرچوو ،
نەما . هام‌باف : هاودەم ، هاوڕاز .

چێش مدەی جەواب خالقی ئەکبەر

جەزەلزەلەی بەزم رۆژی یوم الخطر(٦)

فخر المرسلین سولتانی ئەبرار

جە کەردەی بەدی تۆ بییەن بێزار(٧)

وەبای زیندەگر ئیمرۆ تافەردا

میناى ئیمانی ویت دای وەبەردا(٨)

---

(٦) چێش مدە : چی ئەدەی · جە زەلزەلەی : لە ترس و لەرزی · یوم الخطر : ڕۆژی دوایی ، ڕۆژی هەستانەوە ·

(٧) فخر المرسلین : مایەی شانازیی هەموو پێغەمبەرەکان ( د ، خ ) سولتانی ئەبرار : سەرداری هەموو چاکان ـ بییەن : بووە ·

(٨) ئەم دێڕە بە هەمان واتە و مەبەست لە هۆنراوەی بێ ناوی بەد نام دێڕی یازدەهەمەو لە هۆنراوەی مەینەتان پیرێ نەوەرەنْ دا ، دێڕی پێنجەمە ـ بڕوانە ل٣٩ ـ ل١٢١ ·

# پیتی

## ـ ب ـ

### ـ ١ ـ

بێناوی بەد نام ڕسـوای ڕۆی مـەحشەر

خەجاڵـەت نەڕووی خودا و ئەو سەروەر[١]

ئومێدت وە کێن ؟ ڕووناکیت جـە کۆن

جـە کۆی تاوانت مـەحشەر ڕەنجەڕۆن[٢]

مـەر قاپی ئـەعلامی عـەرەب ئـەو یادکەم

بـەڵ وە ڕەحمی ئـەو خاتر گوشاد کـەم[٣]

**وەرنە سەرگەردان ( یوم الخطـر ) م**

سـۆزیای سەد ڕەنگ ناری سـەقەرم[٤]

بێ ناوی مـەغروور ، ڕاگەی حـەق نـەناس

---

*) لەم هۆنراوەیەدا ، سەودایی سەرزەنشتی دڵ و دەروونی خۆی ئەکا ٠

١) خەجاڵەت : شەرمەزار ٠ ئەو سـەروەر : مەبەستی پێغەمەری مـەزن موحەممەد ـ ص ( د ، خ ) ٠

٢) وە کێن : بە کێیە ٠ جە کۆن : لە کوێیە ٠ جە کۆی : لەکوێی ٠

٣) ئەعلامی عەرەب : بەرزترین و بالآترینی عەرەب ، مەبـەست پێغـەمەرە ( د ، خ ) ئەو یادکـەم : بێنمـەوە یادی خۆم بەڵ : بـەڵکو ٠ ڕەحم : سۆز و بەزەیی ٠ خاتر گوشاد کەم : دڵم شاد کـەم

٤) وەرنە : ئەگینا ـ سەرگەردان : وێڵ ـ یوم الخطر : ڕۆژی ترس‌ولەرز ، ڕۆژی دوایی ٠ سۆزیای : سووتاو ، سەدڕەنگ : سەدجۆر ٠ سەقەر : دۆزەخ ٠٠٠ ئەگینا لە ڕۆژی دواییدا کە ڕۆژی لێپرسینەوەی پڕ ترس و کەس ئاگای لە خۆی و لە کەس نییە ، منیش وێڵ و سەرگەردانم‌و بە سەد جۆر لە ئاگری دۆزەخا ئەسووتێنرێم ٠

موطیع وه هەوا و نەفسی نا سـوپاس(٥)
ڕیش سپی ، ڕووڕەش سەرخۆش و مەدهۆش
تاکەی جەهەنەم پەی وێت مدەی جۆش !(٦)
ویـەردەت ویـەرد ئاگـەڕێتـەوە
ڕۆی قیامـەتـت نـاوڕێتـەوە(٧)
مەر جـە مووی سپی وێت شـەرمت نییـەن !
پۆستت زەعیف بی ، هێمات وەس نییەن !(٨)
تـا کـەی بێزاری جـە دین و طاعـەت
جە ناکەردەییت کـەی مشۆت تاقەت(٩)
تاقـەتت بی تاق ، تاق بیت لـە تاقـەت
ئیســە بێ تاقـەت ، تاقە لێت تاقەت(١٠)

---

(٥) مەغروور : لە خۆبایی • موطیع : گوێڕایەڵ • وە هەوا : بە ئارەزوو • نەفسی نا سوپاس : دەروونی سپلـە •

(٦) سەرخۆش : سەرخۆش بە خۆشی‌یەکی کـورتی ژیـانی کورت • پـەی وێت : بۆ خۆت • مدە جۆش : جۆش ئەدەی ، هەڵئەکەی •

(٧) ویەردەت ویەرد : ڕابوردووت ڕابورد • ڕۆی قیامەتت : ڕۆژی قیامەتت ، هاوار و ڕۆڕۆی ناوڕیتەوە : نابڕێتەوە ، کۆتایی نایە •

(٨) مـەر : مەگەر • پۆستت پێستت • زەعیف بی : لاواز بوو • هێمان : هێشتا • وەس نییەن : بەس نییە ••• بۆچی ، مەگەر شەرم لە مووی سپی‌ی سەرو ڕیشت ناکەی !! وا پێستت بەسەر لەشتا وشکو چرچو لۆچ بووە و بێ هێز و لاوازی ••• ئیتر تا کە ، هێشتا بەس نییە !! (سەرڕوای هۆنراوەکە دووبارەیە !! )

(٩) طاعەت : بەجێ هێنانی فەرمانەکانی یەزدانی گەورە • جە ناکەردەییت : لە کردەوەی ناپەسەندت • کەی مشۆت تاقەت : کەی ئارەزووت نامێنێ و بەسەر ئەچێ !!

(١٠) تاقەتت بی تاق : توانات نـەماوە • تاق بیت لـە تاقەت : لـە توانا و هەوەس جیا بوویتەوە ، تاقە لێت تاقەت : هەوەس و ئارەزووش لـە تـۆ بەدوورە • هـەر هـەمان وشەی ( تاقـەت ) سێ جار بـۆ سـەروا دووبارە کراوەتەوە •

وه بای ژیندەگیی ئیمڕۆزو فـەردا
مینای ئیمانی وێـت دا وه بـەردا[11]
هەوای شەبابی ویـەرد جه دەمـاخ
ها بیت وه هامڕاز ناڵـەو ئـاخوداخ[12]
قووەی سامیعەت دوور نزیك کـەردەن
بینایی بێ نوور نزیك دوور کەردەن[13]
شنەوای گۆشت دوور نزیك کـەردەن
بینایی عەینت نزیـك دوور کـەردەن[14]

---

(11) ئەم تاکه ، لەگەڵ تەنیا جیاوازییەکی زۆر کەما ، له هۆنراوەی ( ئـەی نەفسی سەرکەش گومڕای بێ کەماڵ ) دا ، دوا دێڕه ، وه له هۆنراوه ( ڕاگەی مەینەتان پیری نەوەرەن ) دا ، دێڕی پێنجەمه ... بڕوانـه ل32 ، ل12 .

(12) هەوای شەبابی : هەوەس و ئارەزووی لاوێتی .. ویەرد جه دەماخ : له سەرا نەما .. ها بیت : وا بوویت .. هەوا و هەدەسی سـەردەمی لاوێتیت بەسەرچوو ، دەسمایەکەت پووچ دەرچوو ، وا ئیستا بوویته هاوڕاز و هاودەمی هاوار و ناڵه و ئاخ و داخ ..
13 ، 14 : قووەی سامیعەت : توانای بیستنت .. کەردەن : کردووه .. شنەوای گۆشته : بیستنی گوێت .. سـەروا و ناوەڕۆکی هـەردوو دێڕەکه هەر یەکن .. سەرواش دووبارەیـه .. مەولـەوی نـەمر زۆر جوانی فەرمووه :

> **پۆسی کووسی گۆش نم کێشـان کـەم کـەم**
> **ئی سـەره و سـەرەن دوور بینا کەی چـەم**

« مەلا عبدالکریمی مدرس ، دیوانی مەولەوی ، ل 477 »
پیرەمێردی نەمریش زۆر جوان گوڕیویەتی بۆ سۆرانی :

> **پێسـتی تـەپڵی گوێم شـێی کێشـا ، خاو خاو**
> **ئـەم بـەره و بـەره دووربینـەکـەی چـاو**

دیاره بۆ خۆیشی هەمان‌دەردی چەشتووه

# پیتی

## - ج -

- ١ -

جیلوەی جەلای جام جەمینت جەمەن

جامی جەم نە شەمع جەمینت کەمەن[١]

تا شەعشەعەی شەمع پەروین تە سەرەن

جەلای ئاینەمی ئەو زیاتەرەن[٢]

---

(١) جیلوە : نواندن ، دەرکەوتن · جەلا : ڕووناکی ، ڕۆشنی « جام » ئاوێنە · جەمینت : ناوچەوانت ، ڕوومەتت · جەمەن ، جەمعەن : کۆبووەتەوە ، تەواوە · جامی جەم : ئاوێنەی جەمشید جامی جەم ـ جەمشید ـ لە هۆنراوەی کلاسیك و ئەفسانەی دێرینەدا زۆر جار ناو هێنراوە ، گوایە ئەو ئاوێتەیە جیهانی نواندووە و لە کاتی جەنگیشا هەڵسوکەوتی لە شکری دوژمنی تیا بەدی کراوە ، ··· گەلێ جاریش لە داهاتووی ڕۆزگاری ئەو سەردەمە ئاگاداربوون ·

(٢) شەعشەعە : ورشەو پرشە · پەروین : ئەستێرەی کۆ · تە سەرەن : لە بەرزیدایە · ئاینە : ئاوێنە ··· زیانەرەن : زیاترە ·

# پیتی

## — چ —

— ١ —

چەم پر هەرس و هوون ، دڵ جە ماتەمدا

تای تاقەت تاقەن نە گێجی خەمدا[١]

تاکەی وە هیجران دەروون بدۆ چڵ

یا جارێچ چەمەی چەم کەی وە مەنزڵ[٢]

بەڵ لێلاوی لێڵ جۆنی چەم ڕەوشەن بۆ

کۆکۆی حەسرەتان پەرێم گوڵشەن بۆ[٣]

سا بەڵ ڕەوشەن بۆ دوو دیدەی تارم

خەیلێوەن پەرێت دڵ پڕ ئازارم[٤]

دانە و دامی دەرد دیسان نیاوە

ڕیشەی حەیاتم یەکجار کێشاوە[٥]

هەوەسیای هاژدی هوونەی هەرسی چەم

---

(١) هەرس و هوون : فرمێسك و خوێن . نە گێجی : لە گێژاوی .

(٢) بدۆ چڵ : چڵ بکا . جارێچ : جارێکیش . چەمەی چەم : سەرچاوەی چاو ، بیبیلەی چاو . وە مەنزڵ : بە هەوارگە .

(٣) بەڵ : بەڵکو . پەرێم : بۆم

(٤) تارم : تاریکم ــ خەیلێوەن : دەمێکە . پەرێت : بۆت .

(٥) دانە و دام : دانە و داو . نیاوە : نایەوە ... دیسانەوە دانە و داوی دەردی نایەوەو بە ئێجگاری ڕەگڤ و ڕیشەی ژیانمی لە بن دەرکێشا .

مەتەرسووت تۆفان نووح باوەڕۆ هەم[٦]

وەڵگەکەی سەرتەڵ حەیات شینشـەن

مامەڵەی ویـداع تـۆ نەدیتشـەن[٧]

وەڵگەکەی سەرتەڵ دارەکـەی حەیـات

دیماودیمشەت وە بای ڕای مەمات[٨]

---

(٦) تۆفان : با و بۆران و لافاو و هەڵچوونی ئاو لە هەموو لایەکـەوە ، باوەڕۆ هەم : بەرپا بکا ‥ ئەترسم کە بە هاژە و هەلچوونی لافاوی فرمێسکی چاوەکانم تۆفانی نووح بەرپا بێ ٠

(٧) وەڵگەکەی سەرتەڵ : گەڵای سەرتەرز ـ مامەڵە ویداع : سەودای ماڵ ئاوایی ٠ تۆ نەدینشەن : نەدیتنی تۆیەتی ‥٠ گەڵای سەرتەرزی گەرمەی ژیانم گەرمەی شینیەتی ، چونکە خەریکی ماڵ ئاوایی کردنە لە تۆ و ئیتر چاوی بە دیدارت شاد نابێ ‥

(٨) دیماودیمشەت : ئەمدیوو ئەو دیویەتی ‥

# پیتی

## ـ د ـ

### ـ ١ ـ

دەرد وە بانی دەرد ، زامی کۆنەو نۆ
گردین وە یەکجار ئاوەردەن وە سۆ[١]
کەی مەیۆ تامڵ وەی گشت دەردەوە
وەی کزەی دەروون ، گەیی‌و سەردەوە[٢]
...... باڵات ، بەڵام خەڵاتەت
دیدەم حەسرەتناك سەروی باڵاتەن[٣]
گڕەی گەرمیی دەرد دەروونم تەم دا
زوخاو مەوج مدۆ نە چەمەی چەمدا[٤]
قەڵوازەی زوخاو زامە تازەکەم
نەشئەی تای حەیات وە دەم گازەکەم[٥]
پەی لوای ( ئەحمەد ) سەرگەردانە وێم
ڕووسیای مەجلیس هامدەردانە وێم[٦]

---

(*) بە بۆنەی کۆچی بەڕێز ( حاجی کاك ئەحمەدی شێخ ) ە وە .

(١) گردین : گشت . ئاوەردەن وە سۆ : هێناوەتە سوێ :

(٢) مەبۆ تامڵ : ئارام نەبێ . لە جیاتی ( سەردەوە ) نووسراوە ( دەردەوە ) ، دیارە ئەمە سەهوی تۆمار کردنە ، بێ‌گومان ( سەردەوە ) دروستترە .

(٣) بۆشایی‌یەکە کوژاوەتەوە .

(٤ ـ ٥) لە واتادا دەرئەکەوێ کە ئەم دوو دێڕە پاش و پێش تۆمار کراون ... ئەگەر لە جێی یەکتردا بوونایە واتاکەش ڕاستتر و دروستتر ئەبوو .

سەرکەردەی خەمان ، خاتر خار خارم
پەی لوای ( ئەحمەد ) جە ڕۆح بێزارم[٧]
سا چی بکەم ئازیز نە تۆ تۆی دەروون
وەختەن چوون مەجنوون توون وام تە تۆی توون[٨]
پەی ذیکری قەلبی ، ئەفکارو تەوحید
دەك لێلاییم بۆ پەی تازەو مورشید[٩]
**پـــۆی پـــەلاشـــەی ٠ ٠ ٠ ٠ ٠ ٠ ٠**
سەراپای هەستی وە ئـازار ڕشتـــەم[١٠]
هـا نـە هـەرسی هیجر هاناو هـەی ڕۆشـەن
گەرمـەی دەردشـەت ، ئارەزووی تۆشەن[١١]
زامانـی کـاری وە تیر کـەردەکـەت
وسـت وەهـ ڕای مـەمات دڵ پـەڕ دەردەکـەت[١٢]
دڵ پـڕ داخو دوود ، چەم چـەمەی ئەسرین
هـا ، ها ، عـەزیزم جارێ با بویـن[١٣]

---

(٦) پەی لوای : بۆ ڕۆیشتی ، کۆچی ٠ وێم : خـۆم ٠

(٧) خاتر خارخارم : **دڵم هەلاهەلایە ٠ جە : لە ٠**

(٨) نە تۆ تۆی : **لە توێ توێی ٠ توون وام نە تۆی تـوون** : به دەشـتودەرو دۆڵو چەما وێڵ بـم ٠

(٩) پەی ذیکری قەلبی : بۆ یادکردنی خوا بە دڵ ٠ مورشید : ڕابەر ٠

(١١) بۆشایی‌یەکە کوژاوەتەوە ٠٠٠ هەستی : بوون ٠ ڕشتە : دارێژراو ٠٠٠ سەراپا هەموو بوونی من دارێژراوی ئازار و ئەشکەنجەیە ٠

(١٢) وست وەهـ ڕای : خستیە ڕێی ٠ مەمات : مەرگ ٠

(١٣) دوود : دووکەڵ ٠ چەم چەمە ئەسرین : چاو سەرچاوەی فرمێسك ٠ بوین : ببینێ ٠٠٠ دڵم پڕە لە داخو دووکەڵی ڕەش ، چاویشم بووەتە سەرچاوەی فرمێسکی گەرم ، سا ئەمە خوایە ، بەڵکـو جارێکـی تر بـە دیداری خۆشەویستەکەم شادبم ٠

تا مەحشەر داماو شەق مەوا خاکم
هەر زوخ نۆشی هیجر ئەحمەدی کاکم[14]
( سەودایی ) سەودای حەیاتش وەردا
ئیمەیچ سەفەرمان ئەمڕۆ ، یا فەردا[15]

---

(١٤) ماما : دێ · شەق مەوا : شەق ئەیا ··· تا ڕۆژی زیندوو بوونەوە و شەق بردنی گلکۆکەم و ڕاستبووتەوە ، بۆ گۆچی ئەحمەدی کاکی ، هەمیشە هەر زوخاو ئەنۆشم ·

(١٥) وەردا : بەردا · فەردا : سبەی ·

داخ وه بانـی داخ ڕزخاوی(*) خاڵت
سـەیرانگای وه شەوق دارەکـەنی هاڵت(١)
ڕزەی ڕەنگڵەی زەڕ پای سـەقر و شمقاڕ
چریکـەی تەواران شـەهێنی خووتخوار(٢)
ئیسـته جه دووریت بێشەوق‌و کـەیفـەن
ڕێزەی جـەرگم بـۆ ، سەد هەزار حەیفەن(٣)
سـارای بازیان وه بێنـاز کـەفتـەت
کڵپـەی هـەناسەش چوون کوورەی تەفتەن(٤)
تاقیـق ئـەویچ دەرد هیجرانش وەردەن
یـا چوون من باڵای مەحموود گم کەردەن(٥)
خرنگـه بۆرچینان پۆڕچـەی تاوس تـەرز
بێ دەماخ نـه داخ سـوڵتانی ڕووی ئـەرز(٦)
خاڵۆت وەی گشـت زام خـەتەرناکەوه

---

(*) ئەم هۆنراوەیەشی به بۆنەی بەدیل‌گرتنی شێخ مەحموودی نەمـرەوه دانـــاوه ٠

(١) دارەکەی هاڵ : کۆمەڵێ دار بەڕوون ، کەوتوونەته سەر گردێ ، لـه تەنیشت گوندی هاڵەوه ، لەولای ئەڵڵایی‌یەوه ، لـه سەر ڕێی گونـدی دێلێژه ٠٠ جێی حەوانەوەی شێخ بووه ٠

(٢) ڕەنگڵەی زەڕ : زەنگوڵەی زێڕ ٠ سەقر : صەقەر ، هەڵۆ باڵندەیەکی دڕ و بەچنکی ڕاوکردنه ٠ که ماڵی ئەکرێ و مەشقی ڕاوی پێ ئەکـرێ ٠ زەنگوڵەیەکی بچکۆله ئەبەسترێ به قاچیەوه ٠ شمقاڕ : ئەمیش باڵدارێکی وەکو هەڵۆیه ٠

(٣) ڕێزەی جەرگم بۆ : جەرگم داڕزێ ٠

(٤) سارا : دەشت ٠ کەفتەن : کەوتووه ٠ تەفتەن : تەوته ٠

(٥) تاقیق : تحقیق : بێگومان ٠ وەردەن : خواردووه ٠ گم کەردەن : گوم کردووه ٠

(٦) بۆرچین : مراوی ٠ پۆڕچه : پۆڕ ٠ تاوس تەرز : وەکو تاوس ٠

ئومێد هەن وە ڕات تەنیای تاکەوە[٧]
بوینۆ جە نەو باڵات سەراسەر
وشکاوش بەیۆ جۆی زۆخی جگەر[٨]
پۆی پەلاسەی پۆس ڕوخاوان چەشتەم
سەراپای هەستی وە ئازار ڕشتەم[٩]
خاڵۆ جە دووریت حەیات بێزامەت
ڕێزیای ئەسرین وە تاو ڕێزامەن[١٠]
ڕەگی تەن تاڵ تاڵ جە هەم وەلاوەن
وە مەودای ئەڵماس دووریت ، بڕاوەن[١١]
هەر بەند جۆشی سەخت ها نە دەروونْدا
مەر وە وێنەی قەیس شووم وە تۆی توونْدا[١٢]
وارگەی مەینەتان قەیسی دڵ خەمین
کەروون وە یاتاخ پەرێ شەو تاڵین[١٣]
تا شوون وە کۆی تەژد تەن ڕوخاڵەوە

---

(٧) وەی : بەم ، هەن : هەیە ،

(٨) (٩) بوینۆ : ببینێ ، جە نەو : لە نوێ ، وشکاوش بەیۆ : وشکاوی بێ ، جۆی زۆخی : جۆگەی زوخاوی ،
بەلاس : پەڕۆ و بەرگی شڕ ، پۆس : پێست ،، چەشتە : چێشتوو ،
هەستی : بوون ، ڕەشتە : ڕەشتە : ڕەشتوو ، داڕێژراو ،،،، لە نوێ
کە چاوم بە باڵات بکەوێ ، جۆگەی زوخاوی جگەرم وشکاوی بێت و
کۆتایی بێت بە بەرگی شڕ و وڕم و سەراپای بوونی پڕ زوخاو و ئازارم
بکەوێتە شاد ،

(١٠) حەیات بێزامەن : ژیانم بێزراوە ، لەبەر چاوکەوتووە ـ ئەژی ،

(١١) ڕەگی تەن : دەماری لەش ، جە هەم وەلاوەن : لە یەك جیایە ئەشکرێ
بوترێ : تێك ئالاوە ،، وە مەودای : بە تووکی تیژی ،

(١٢) هەر بەند : هەر ئەوەندە ، ها تە : وا لە ، مەر : مەگەر ، شووم : بچم

(١٣) وارگە : هەوارگە ، مەڵبەند ، کەروون : بکەم ،، پەرێ : بۆ

نالآن وام هـاردەم وە مەلاڵـەوە[١٤]

وەی ڕیشی سفید وەی ڕووی سـیاوە

ڕوو ماڵووم بـە خاك کاوەتوڵڵاوە[١٥]

جـەو مـەقامی خاس حـەزرەتی خـەلیل

جـە موارەکی زەبیـح ئیسـماعیل[١٦]

ڕوو ماڵم نـە خاك وە حـەزینـەوە

وە کـزەی دەروون ئاهیرینـەوە[١٧]

داناندەی ئـەسـرار سـڕی نیهانی

جـەو « ما في » الصـدور » وێت خاس مزانی[١٨]

وە لوطفی عـەمیم عیلمی عـەللامت

بـە حـەقی ئـەسرار نـە تۆی کـەلامت[١٩]

ڕەحمێ کـەی وە حـاڵ ئـەی ڕووسـیاوە

(١٤) کۆی نەژد : کێوی نەجد ، هەوارگەی قەیس ٠ نالآن دام : بناڵێنم ٠ وە مەلاڵەوە : بە کز و زویری ٠

(١٥) سفید : سپی ٠ وەی ڕووی سیاوە : بەم ڕووە ڕەشەوە : ڕوو ماڵـووم : ڕوومەتم هەڵسووم ٠

(١٦) مەقامی حەزرەتی خەلیل : نشیتکە و جێ‌نوێژی حەزرەتی ئیبراهیـم ٠ جە موارەکی ــ موبارەکی : لە پیرۆزی ٠ زەبیح : سەربڕراو ٠

(١٧) ئاهیرینەوە : ئاگرینەوە ٠

(١٨) داناندەی ئەسرار : زانا و بەئاگا بە هەموو نهێنی‌یەك ٠ سڕی نیهانی : نهێنیی نادیار و پەنامەکی ٠ جەو : لەو ٠ ما في الصدور : هەرچی لە سنگ و هەناوایە ٠ وێت خاس مزانی : خۆت باش ئەزانی ٠

(١٩) وە لوطفی عەمیم : بە سۆز فراوانت ٠ عیلمی عەللامت : زانایی لـە ڕادە بەدەرت ٠

شـا مەحموود وینووم لادێ جـە لاوە[٢٠]

خاڵۆ ، خاڵۆکـەت خـەمان خـەم کـەردەن

پـەی قاپیی عـەدەم ئامادەم ئامادەم کەردەن[٢١]

بـەند ئـەسرینی گـەرم وە چەمدا ڕێزا

موژەی مـەینەتیم تۆی دیـدە بێزا[٢٢]

بـڕیا بـەندی دڵ ، ڕزیا پەڕەی جـەرگ

ئای لـەو ژیانـە ، سـەد خۆزگـە وە مەرگ[٢٣]

---

(٢٠) وینووم : بیینم • لادێ ( پیتی د منگنە ) : کەمێ ، توزێك •

(٢١) خەمان خەم کەردەن : خەم چەماندوویەتەوە • عەدەم : مردن ، مەرگ •

(٢٢) وە چەمدا : بە چاوا • ڕێزا : ڕژا : هاتە خوارێ • موژە : برژانگ •
بێزا : لێی بێزرا •

(٢٣) بڕیا : بڕا • ڕزیا : داڕزا •

# پیتی

## ـ هـ ـ

ـ ١ ـ

هەسارەی تاڵەی شوومی تاڵەی شووم

نەگێجاوی دەرد ، دەریا بی نگووم[١]

ها نە گۆشەی تار بەحرەکەی بێ پەی

نییەن جای ئومێد کەی بییەن ، وەی ، کەی[٢]

تۆ وە تیر تەڕەکەش تا وادەی ....

کاری زار وەسەن ، مۆبەت کەر وە کار[٣]

من تەن سقنەکەی خەستەی زام خەتەر

سا تۆ خۆفت بو جە ( یوم المحشر )[٤]

من هیچ بەرکەنار ، جەستەی خەستەی زام

شادی و ، وەشی و عەیش سمووەن جە لام[٥]

---

(١) هەسارە : ئەستێرە • بی نگووم : سەرنگووم بوو ، نوقم بوو ... لە نائومێدی و بەختیم ، تروسکەیەکی ئەستێرەی هیوام هەبوو ، ئەویش لە گێژاوی دەریای دەرد و ئازارا سەرنگووم بوو •

(٢) ها : وا • بێ پەی بن و سنوور •

(٣) کاری زار وەسەن ! پیشەی گریان بەسە • مۆبەت کەر وە کار : خۆشەویستی بخەرە کار ، بەکار بێنە .. پۆشەکە کوژاوەتەوە تیرتەڕکەش : تیری تازەو ئامادەی ناوکەوان •

(٤) تەن سفتە : لەش ـ جەستە ـ سووتاو •

(٥) بەر کەنار : بخە ئەو لاوە ، بایەخی پێ مەدە ، سمووەن جە لام : لە لام ژەهرن •

بەڵام تـۆ وە عەشـق شـەونشینی شـەو

وە تـۆفانی تۆف تـۆی دەروون وە دەو[٦]

وەس وەشەست قەستی جەستەی خەستەم کـەر

لادێ ڕووی عەطات وە ڕووی من ( ڕوو ) کەر[٧]

بەڵ گەردەکەی پای ئـەو گـەردەن بێ‌گەرد

مەڵهەم دۆ نە تۆی دەروونی پـڕ دەرد[٨]

---

(٦) وە دەو : بە گورجی ، بە خێرایی ·

(٧) وەس وەشەست : بەس بە تیر · قەستی جەستەی خـەستەم کـەر : نیاز و مـەبەستت جـەستـەی خـەستـە و بیمار من بێ · عـەطا : بەخشینەوە · بە دوو وشەی ( من ڕوو ) سەروا تێـك ئەچێ ·· ئەبـێ وشەیەکی تر بێ و سـەرواى بگونجێ ، بـۆ نموونـە ، وەکو وشـەی ( گەستـەم ) ·

(٨) بەڵ گەردەکەی پای : بەڵکو تۆزی پێی · مەڵهەم دۆ : مەڵهەم بدا ··

هەوری ڕووی ڕەحمەت بێپایانی حەق
جە کارخانەی غەیو ، غەیووری موطڵەق[١]
ڕەحمەت ڕەوان کا ، تا ئاخیرەلکار
وە ماوای مەحموود ، مەحبووبی موختار[٢]
هەر ساتێ سەد جار سەرڕێژ کا وە تاو
پەی پاکانی پاك گشت ئال و ئەصحاو
زرنگەی قافڵەکەی مەینەتبارەکەم
دیارداو ئاما سەرقەتارەکەم[٣]
سەرقافڵەباشی وارگەش نیاوە
وارگە و کێلگەی خەم دیسان دیاوە[٤]
فەوجی بارخانەی خەمان لام جەم بی
دیدە و دڵ ، دەروون وەهەمدا تەم بی[٥]
تەم و نم و غەم جۆش دا وە هەم دا
••••• حەسرەت سەرکەرد وە چەمدا[٦]

---

(*) دیسانەوە بۆ شێخ مەحموودی نەمر ·
(١) بێپایان : بێکۆتایی ، بێئەندازە ·
غەیو : غەیب ، نادیار · غەیووری موطڵەق : یەزدانی گەورە ، توانا هەمیشەیی و لە ڕادەبەدەرو نەبڕاوەیە ·
(٣) زرنگە : دەنگی زەنگ · دیاردا : دەرکەوت · ئاما : هات · سەرقەتار : پێشەنگی کاروان ·
(٤) وارگەش نیاوە : بارگەی نایەوە ، خست · دیاوە : دەرکەوتەوە ، دیاری دایەوە ·
(٥) فەوج : کۆمەڵ · جەم بی : کۆبووەوە · وەهەمدا : بەیەکا · پێکەوە ·
(٦) بۆ شایی‌یەکە ڕوون و دیار نی‌یە ، لە وشەی ـ نەوەردی ـ ئەچێ ، بە واتای نەبەردی ، سەر ـ ڕسەختی ··· ئەم وشەیەش دروست و گونجاوە · چەم : چاو ·

شـوومی تاڵـەی شـووم تاڵی تاڵ خۆراك
نیشـتەی پای میجراو حەسرەت‌و غـەمناك[7]
ئـازیز دێرمـەن بنمانـە باڵا
سـینەم کـەر وە تیغ مـەینەت یەکاڵا[8]
پا بنیـە وە بان داغمـەی جـەرگم‌دا
هوونـەی هوونی جەرگ وەسـەر بەرگم‌دا[9]
بـەڵ ڕسـتگار بووم جـەی گشت دەردەوە
کۆچ کـەرووم وە تاو ئـەودیو پـەردەوە[10]
بدیـە داغمـەی جەرگ چوون دیاری‌یـەن
وێنـەی فواران هوون لێش جاری‌یـەن[11]
تاکـەی زووخی زام بادەی جامم بـۆ
شـادی‌و وەشی‌و عەیش ئێش زامم بـۆ[12]

---

٧) شووم ، شۆم : نەگبەتی • تاڵە ، طالع : بەخت ، چـارە • نیشتـەی : دانیشتووی •

٨) دێرمەن : درەنگمە • بنمانە باڵا بنوێنـە • ئـەم دێڕەش بـە کـەمێك جیاوازییەوە لە ل٢٢ دا یەکەم دێڕە •

٩) پا بنیە : پێ بنێ • وە بان : بەسەر • داغمە : داخ ، جێی داخ‌کراو • هوونی جەرگ : قوڵپی خوێنی جەرگ •

١٠) بەڵ : بەڵکو • ڕستگار بووم : ڕزگار بم ــ جـە : لـەم • کەرووم : بکەم • وە تاو : بە گورجی ، خێرایی •

١١) بدیە : بڕوانە ، سەیر کە • دیاری‌یەن : دیارە • هوون لێش جاری‌یەن : خوێنی لێ ئـەچێ •

١٢) زووخ : هەوو کێم • بادە : مەی • تا کەی هەو و کێم و زوخاو لەجیاتی مەی جامم بێ‌و ، ئازاری زام‌و برینم لە جیاتی ژین‌و شادی‌و خۆشیـم بـێ ••

زەبوونی و دەردی نەهاتی و ، ذیکری خوا بۆ ڕەحمەتبارین
ئەڵێی عالەم بەڕۆژووە و ساڵ هەر مانگی ڕەمەزانە
چاوەڕێی هیلالی عیدین شەووال ڕەحمەتی خوا بێنێ
عالەم نەجات بێ لە شەڕی ئەم شەیتان و کافرانە[1]
لە ترسی مەرگ و بێ نانی هاری کردین ، ڕاستی نەما
دزی و جەردەیی و پیاو کوشتن بووە بە کاری ڕۆژانە
سەگ و پشیلە و مەردوم وەك یەك لە لاکی یەکتر ئەخۆن
کێ ئازایە سەری دەرکا و بگاتە ڕۆژی فەرحانە ![2]
شێخ دەروێشی بەردا ، تەکیەی بێ نان ، دەنگی دەفی نایە
لە دەردی ئاوڵە و تاعوون و سیل عالەم گشت پەرێشانە
زەمانێکی پڕ ئاشووبە ، جەوهەری پیاوەتیی تکان
ئاشتی نەما ، هەرکەس خەمەخۆیەتی ، شیوەنی نانە
هەزاران قەل و داڵ خواردی ، بەختیارە ئەو کەسەی تێرا
قەدر و حورمەت قۆڕەی سکە ، کەس بە کەسێ ناڵێ گیانە
دایك و باوك نانە ، ئەمڕۆ عافیەت خوشك و برایە
کەسیەتی سەرەخۆرییە ، چوونیەکی لە سەرقەبرانە
پاروو لە قوڕگی شێرایە ، هەر چەكبەدەس حەساویە
تەگیەتیی هەژارە شەڕی نەهامەتی ئەم جیهانە
لەم بەختە ڕەشە ! •• ئینگلیز و ڕووس شەڕ ئەکا کورد تیائەچێ

---

(١) هیلالی عید : مانگی کەوانی جەژن ••• لە ئێوارە دوا ڕۆژی ڕەمەزانا کە مانگ ئەبینرێ کەوانێکی باریك و بچکۆلەیە • شەووال : مانگی شەووال •• یەکەم ڕۆژی مانگی شەووال یەکەم ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانە •

(٢) ڕۆژی فەرحانە ، فەرەح : ڕۆژی گوشادی و شادی •

ئـەم کوردە لانـەوازە هـەر بـەشی شـەق و تیھـەڵدانـە[٣]
سوخرە و بێکـاری ، بە لاتـی و هێشـتا بۆڵـە و شـەقی ئاغـا
پـــەرتـەوازەی بێسـەرداریـن وا ئیسـتیقلالمان گـرانـە[٤]
عالـەم یەك نەگرێ و یـەك دڵ هـەوڵێ نـەدەن بـۆ ئیستیقلال
بـەلآمـان هـەزار بـەلآیـە و کوردسـتان هـەر گۆڕسـتانـــە
کـوردە ، غیرەتـێ فرسـەتـە ئـــەمڕۆ ، لادە لـــە تاکۆکـی
بـەدی و خەیانـەت بەسـە ، بـۆ یەکێتـی ڕۆژی مـەردانـە[٥]
بـــۆ کورسـی و پـارە خزمـەتی بێگانـە دادی گـــەل نـادا
لـــە هـەموو شـت پیرۆزترە ڕزگـاریی ئـەم کوردسـتانـــە
خوایـــە ، کـردەوەی خراپـی خۆمانـە وا حاڵمـان شــــڕە
نـەجاتمان دەی بـە ڕەحمەتی خـۆت ( سبحان الله ) سوبحانە[٦]
( انا للـه و انـا الیـه راجعـون ) بڵـی ••

سەودایی ـ کە ئاشـتی و خۆشی دێ لـە پاش شەڕو تەنگانە[٧]

---

(٣) ڕووس : ڕووسی قـەیسەری ••

(٤) سوخرە : بێکاری •• ئیش پێکردن بە زۆر و شـەق و بـێ کـرێ •
پەرتەوازە ، پەرەوازە : پەرش و بلاو • ئیستیقلال : سەربەخۆیی ••

(٥) لە سەردەم و کۆتایی جـەنگی جیهانی یـەکـەما ، هـەموو گـەلـە
ژێردەستەکانی ئیمپەراتۆریـەتی عوسمـانلی ڕاپـەڕین و داوای ئـازاد
و سەربەخۆییان کرد •• لەو کات و دەرفەتە بەجێیەدا شاعیر زیاتر
بانگەوازی خۆی بەرز ئەکاتەوە بۆ گەلی کورد •

(٦) سبحان الله : پاکی و بێگەردی هەر بۆ خوایە •

(٧) انا لله وانا الیه راجعون : ئێمە بوو نەوەری خواین و هەر ئەگەڕێنیـەوە
بۆ بارەگای خـۆی ـ قورئانی پیرۆز •• ئـەم ئایەتـە لـەوەختی هاتنی
مەرسك بەڵو مسیبەتدا ئەخوێنرێ • ئاشتی و خۆشـی دێ لـە پـاش
شەڕ و تەنگانە : ئاماژەیە ـ ئیشارەتە •• بـەم ئایەتـە پیـرۆزە کـە
ئەفەرموێ : انَّ مع العسر یسرا •

– ١ –

## وارثی میراتـی نـالی و مـەثنـەویـم

## جانشینی زێوەر و مـەعبدورحیم[1]

(١) واریث : ئەو کەسەیە کەلەپووری پێشووابن بۆ ئەمێنێتەوە : میرات : کەلەپوور ٠ مەثنەوی : زانا و شاعـیر گەورەی تەصـەووفی ئێـرانی ، لە بوار و ڕێبازی تەصەووفدا دیوانەکەی بەناوبانگترین بەرهەمـە ٠٠ زێوەر : بۆم ساخ نەبووەوە مەبەستی لە کێیە ٠٠ ناشکرێ مەبەستی لە زێوەیی شاعیر بێ ــ عەبدوللا کوڕی محەممەد کوڕی مەلا ڕەسوول ، ١٨٧٥ ــ ١٩٤٨ ــ بەتایبەتی سەودایی زۆر لە زێوەر بە تەمەنتر بووە و « ٢١ » ساڵیش پێش ئەو مردووە و نەبـووە بە کەلەپوور گیـری ٠٠ لە ڕۆژنامەی ژیندا ، ژمارە ٩٤٢ ، ڕۆژی ١٨ ی تشرینی دووەم ، ساڵی ١٩٤٨ ، مامۆستـا پیرەمێرد نـەمـر دەربـارەی شاعیرێکمـان ، کـە نازناوی ٠ زێوەرە

ئەم بابەتەی خـوارەوەی نووسـیوە

زێوەری بـــە قـــەدر

( ئەمڕۆ لە کۆنە کاغەزیکا ، کۆنە غەزەلێکی ( کۆنە ) شاعرێکم دۆزییەوە، با تازەکان بتوانن تەرزی پێ بشکێنن ٠٠٠ )

بەسراوی داوی چاوی شۆخێکی نەوجەوانم گیراوی تاوی داوی راوکەری عاشقانم دەلیلی لەیلی بێ مەیل ، مەجنوونی وێڵی دوجەیل بێ یار و کار و بارم ، هاوشانی وەحشیانم تکا ، شکا ، بەجارێ : شەراب و شوونەکەی دڵ دەرکەوت ڕازی نیهانم ، ئەیشتە سەرِ زوبانم لە داخی باغ و ڕاغی ڕووی بلبلم ئەناڵم لە دووریی سەروری باخی، فم کە پڕ قوغانم مەنـوارە گفتو گۆی من ، بنوارە جستوجۆی من شیرینە شیعرو نەثرم ، مەدداخی دڵبەرانم دڵ بۆ تۆ بۆتە بۆتە ، پڕ ئاگر و بەتاوە وا دڵ لەدەستچوو ، ئەمجا خەریکی پاسی ئیانم من پەستی شەستو مەستی چاوەمەستو عیشوە خەستەم موحتاجی باجی ماچی ڕوومەتگوڵی جینانم سەدبارە حیلەبازی ، جارجارە دڵنەوازی گاهێ لە سەر زەمینم ، گاهێ لە ئاسمانم « زێوەر » غـولامی خۆتە ، تۆ بێوەفاییی خۆتە جارێك پێی بڵـێ وەرە ، تۆی عەبدی ئاستانم ٠٠٠

لە سەرنجدانی ئەم بەرهەمە بەرز و دانسقەیەدا توانا و پلەی هونەری و ڕادەی ئەدەبیی ئەم کەڵە شاعیرە کۆنە مان بۆ دەرئەکەوێ ٠٠٠ جا ئەکرێ

←

